# سەرەتایەک بۆ بەرنامەسازی لە

# ڤیژوەل بەیسک




**زنجیرە کتێبی سەرەتایەک بۆ پرۆگرامسازی**

**کتێبی یەک**

ئالان قەرەداغی

# زنجیرە کتێبی جیهانی پرۆگرامسازی

## کتێبی یەك

## سەرەتایەك بۆ بەرنامەسازی لە ڤیژوەل بەیسك


ئالان محی الدین قەرەداغی

خوێنکاری زانستی فیزیا/زانکۆی هەڵەبجە



ساڵی 2018

# پێشەکی

تا دێت شارستانیت و مرۆڤایەتی بەرەوپێش دەچێت و تەکنەلۆجیا گەشەسەندنی زۆری بەخۆیەوە بینیوە بەتایبەت لەم ساڵانەی دوایدا کە ئینتەرنێت و تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان تەواوی کوردستانین گرتۆتەوە، بۆیە لە ئێستادا بە ئەلکترۆنیکردنی پرۆژەکان و کەرەستەکانی دەوروبەرمان خواستی زۆر لەسەرە، پرۆگرامسازیش یەکێکە لەو ئامرازانەی کە دەتوانیت ئەو کارانەی پێبکەیت کە دەتەوێت، وەلەو ئەم بەشە لە زانکۆکانی کوردستان تا ڕادەیەك ئیهمالکردنی پێوە دیارە، بەلأم ئەوەی بیەوێت بەڕاستی ببێتە پرۆگرامساز و بەرنامەی خۆی هەبێت نابێت چاوەڕێی مەنهەجی زانکۆ و پەیمانگاکان بکات بۆ فێربوون چونکە پرۆگرامسازی و کۆمپیتەر بە گشتی بابەتگەلێکن کە لەگەڵ حەز و خولیایی بەکارهێنەر پەیوەستە و بابەتێکی پراکتیکیە بۆیە ئەگەر حەز و خولیات بۆی هەبێت، هیچ پێویست بەوە ناکات لە زانکۆ یان هەر جێگایەکی تری حکومی بۆی بخوێنیت بەڵکو تەنها حەز و خولیای خۆتی پێویستە، تەنانەت ئەتوانم بڵێم ئەگەر بەدڵ و بە خۆشەویستییەوە کار بۆ ئەو بوارە بکەیت کە حەزت پێی هەیە ئەوا بە دەڵنیایەوە لە زۆر خوێندکاری خریجی ئەو بەشانە زیرکتر دەبیت و لە بوارەکەدا لێهاتوتر دەبیت، بەداخەوە زانکۆکانی ئێمە کەمتر کار لەسەر لێهاتووی و حەز و خولیای تەلەبە دەکەن و زیاتر بە پێوەری نمرە تەلەبە وەردەگرن نازانم بڵێم بێ ئاگان لەوە یان نا، بەلأم ئەتوانم بڵێم ئەم سیستەم تازەیە سیستمی ڕاستەوخۆ تا ڕادەیەك حەزی خوێندکاری تیا فەراهەم کراوە بۆیە سودی زیاتری هەیە هەم بۆ کۆمەڵگا و هەم بۆ داهاتووی خوێندکارەکە.

ئەوەی گرنگە لێرەدا ئیرادەی تۆیە تۆ ئەگەر کەسێکی حەز و خولیای پرۆگرامسازیت هەیە یان ئەتەوێت فێری کۆمپیتەر و پرۆگرامەکان بیت ئەوا زۆر ئاسانە و بە هەوڵدان و کۆڵنەدان دەتوانیت بگەیت بەوەی کە دەتەوێت بێ گوێدانە خوێندن و دەرەجەی سەر کاغەز!!

منیش یەکێك بووم لەو کەسانەی کە زۆر خولیای بواری سیکورتی و پرۆگرامسازیم هەبووە و هەیە، بەلأم بەهۆی کەمی نمرەوە نەمتوانی لە بەشی پرۆگرامسازی یان زانستی کۆمپیتەر وەربگیرێم، لەگەڵ ئەوەشدا سارد نەبومەوە و ئیرادەم هەبوو و لەگەڵ خوێندنی وانەکانی زانکۆ هەرکات مەجالم هەبوایە خۆم بە کۆمپیتەرەوە خەریك دەکرد و لە بواری پرۆگرامسازی لە کتێب و گۆڤار و سایتەکانی ئینتەرنێت دەمخوێندەوە،

سوپاس بۆ خوا ئێستا تا ڕادەیەك ئاستم باشە لەم بوارەدا و ئەتوانم بڵێم گەیشتووم بەو ئاستەی کە لێـی ڕازیـم، هەرچەندە بواری کۆمپیتەر و پرۆگرامسازی وەکو گەردوون و فیزیا وایە زانستێکی تـا ڕادەیـەك بـێ سـنورە و تادێت فراوانتر و ئاڵۆزتر دەبێت، بەڵام ئەوەی کـە لـە هەوڵـدان نەوەسـتین و بـەردەوامبین خـۆی لـە خۆیـدا سەرکەوتنە.

ئەم کتێبەی کە لە بەردەستدایە دوای بەکارهێنانێکی زۆر و دروستکردنی چەندین پرۆژە و بەرنامەی بچـوك و تاقیکردنەوە ئەزموونی چەند ساڵ بەکارهێنان نوسیومە، هەوڵمداوە لە سفرەوە باسی بکەم(ئەگەرچی پێویسـتە لانی کەم خۆت سـەرەتایەکت لەگـەڵ کۆمپیتـەر هـەبێ) تـا دەگەیتـە ئـەو ئاسـتەی کـە خـۆت بتوانیـت بـۆ کاروبارەکانی ڕۆژانە پرۆژە دروستبکەیت، بۆیە لەوانەیە سەرەتاکەی بۆ کەسێك کە شارەزاییەکی سەرەتای لـە بەرنامەکە یان پرۆگرامسازی هەیە تا ڕادەیەكماندوکەر بێت یان باشتر بڵێین کات بـەفیرۆدان بێـت بـۆ ئـەو لەبەر ئەوەی، ئەوەی لە سەرەتاوە باسم کـردووە بـە وردی هـەموو ڕێگاکـانم ڕونکردۆتـەوە و چـەند جارێـك کۆدەکانم نوسیوە تا ڕابێیت لەگەڵ نوسینی کۆدەکان، پاش ڕاهاتن ئیدی پێویستە خۆت هەوڵی لەگەڵ بدەیت و هەوڵبدەی لە بابەتەکان تێبگەیت چونکە ئەگونجێت من هەندێ جار لە تایپ یان نوسینی کۆدەکان هەڵـەی خاڵبەندیم کردبێت و پێم نەزانیبێت، بۆیە نابێت تەنها پشت بەمە ببەستیت بەڵکو ئەبێت خۆت زیاتر تاقیکردنـەوە بکەیت لەسەر نوسینی کۆدەکان و تەواوی بەرنامەکە، لە کتێبەکانی دواتـر ئـەو ڕونکردنـەوە وردە نامێنێـت و زیاتر کات بە نوسینی کۆدە گرنگەکانەوە دەگرین و چیتر باسی دیزاین و تایبەتمەندی ناکـەین لەبەرئـەوەی لە ئاستێکی تردایت و پێویستە خۆت هەوڵی لەگەڵ بدەیت.

بوارەکانی کۆمپیتەر و پرۆگرامسازی وەك فیزیا و ماتماتیك وایە هەمووی بیرۆکە و فکرەیە بۆیە ئەم وانـەکانی مێژوو و جوگرافیا نییە کە تۆ دەرخی کەیت و وەك خۆی بیڵێیتـەوە پێویسـتە خـۆت فکـرەی تیـا بدۆزیتـەوە و تازەگەری تیا بکەیت، هەرچەندە هەوڵەدەم بە کۆمەڵێك فکرە ئاشنات بکەم، بەڵام ئەمـە بـەس نییـە بـەڵکوو پێویستە خۆت تازەگەری تیا بکەیت من لێرەدا تەنها ئەساسیات و بنچـینەی کارەکانـت پـێ دەڵێـت تـۆ خـۆت دەتوانی کاری زۆر جوانتر و سەرنجڕاکێشتر بکەیت.

*ئالان محی الدین قەرەداغی خوێندکاری زانستی فیزیا/زانکۆی هەڵەبجە*

**بۆ ڤیژوەل بەیسك 2010؟؟**

**بێگومان زمانــەکان و بەرنامــەکانی پرۆگرامســازی زۆرن و هەریەکــەیان بــەپێی تایبەتمەنــدی خــۆی ســود و بەکارهێنانی هەیە, لەم کتێبەدا ئێمە باس لەسەر ڤیژوەل بەیسك 2010 دەکەین بۆ دروســتکردنی بەرنامــە و پرۆژەکانمان و لە کۆتای کتێبەکەش ئەوەی باسمان کردووە بە چەند نمونەیەك پرۆگرامی پێ دروســتدەکەین لەگەڵ چەن ڕاهێنانیك لێرەدا لەوانەیە پرسیار بکەی بۆ لە ڤیژوەل بەیسکەوە دەســتپێکرد؟ یــان بــۆ ڤیــژوەل بەیسکی 2010؟؟**

**لەبەرئەوە ڤیژوەل بەیســکم هەلبــژارد و بەتایبــەتتر ڤیــژوەل بەیســکی 2010 لەبەرئــەوەی بەرنامەیــەکی تــا رادەیەك ئاسانە لە بەکارهێنان و کۆد نوسیندا و تایبتمەندی زۆر و ناوازەی تێدایە و لەکاتی کۆد نوسین خــۆی وردە هەڵەکانت بۆ ڕاست دەکاتەوە(بە تایبەتی هەڵەکانی خاڵبەندی)، جگە لەوەی زمانی نوسینی کۆدەکانی زۆر لە زمانی مرۆڤەوە نزیکە بەوەی کە بە ئاسانی ئەتوانیت لێی تێبگەیت، ڤیژوەل بەیسك سەرەتایەکی باشــە بۆ چوونە ناو دنیایی پرۆگرامسازی و تێگەیشتن لە کۆدەکان و دروستکردنی پرۆژە، بۆیە بەباشم زانی لێــرەوە دەستپێبکەم.**

**له پشت بەرنامەکانەوە چی هەیە؟؟ کۆد!!**

**0101010 ئێمە لەمە تێناگەین!! بۆ؟ چونکە زمانی کۆمپیتەرە**

**هەموو کارەکانی کۆمپیتەر و پرۆگرامانەی کە ئێمە بەکاریان دێنین هەر لە سادەترین پرۆگرامەوە تا گەورەترین پرۆگرام لە بنەڕەتدا لە چەند 0 1 پێکهاتووە**

**0 1 دوو ژمارەی کۆمپیتەرە کە پیی دەوترێت سیستمی باینەری و کۆمپیتەر تەنها لەم دوو ژمارە تێدەگات، ئێمە لە ڕێگەی کۆمپایلەرەوە(1) ئەو بەرنامەی دەمانەوێت بینوسین دەیگۆڕین بەو 0 و 1 تا کۆمپیتەر لێی تێبگات و کۆمپیتەریش تەنها لە دوو دوو ئاماژە تێدەگات کە ئەویش (بەڵێ یان نەخێر) یان 0 و 1 یان بەرز و نزم یان هەڵکردن و کوژاندنەوە کە ئەمانە زیاتر بە 0 و 1 دەردەبڕێت 0 واتە نەرێنیەکەیە و 1 واتا ئەرێنیەکەیە، سیستمی باینەری و زمانی کۆمپیتەر بابەتێکی زۆر فراوانە، بەلاّم لەبەرئەوەی لێرەدا باسەکەی ئێمە ئەمە نییە بۆیە لەوە زیاتر لەسەری ناڕۆین، لەم کتێبەدا بۆ بەرنامەنوسین ڤیژوەل بەیسکی 2010 بەکاردێنین و لەڕێگەی کۆدەکانەوە فرمان بە بەرنامەکە دەکەین کە چی بکات. تەنها ئەوەندە بەسە بزانیت کە کاری تۆ وەکو پرۆگرامساز ئەوەیە لەڕێگەی یەکێك لە زمانەکان یان بەرنامەکان بەرنامەیەك بنوسیت و کۆمپایلەریش ئەو کۆدانەی کە نوسیوتە بۆت دەکات بەو 0 و 1 تا کۆمیتەر لێی تێبگات و جێبەجێی بکات.**

**سیستمی پێویست بۆ کارکردنی بەرنامەی ڤیژوەل بەیسك**

**بۆ ئەوەی بەرنامەی ڤیژوەل بەیسك لەسەر کۆمپیتەرەکەت کار بکات لانی کەم پێویستە تایبەتمەندی کۆمپیتەرەکەت لەم تایبەتمەندیە کەمتر نەبێ**

**ڕاژە: ویندۆس ئێکس پی،** 7، 8، 8.1، **ڤیستا،** 10

**جۆری هاردوێر**

**جۆری بت:** 32 **بت،** 64 **بت**

**ڕام:** 2 **گێگابایت زیاتربێت باشترە**

**گرافیك کارد: توانای سەپۆرتی دایرێکت ئێکسی** 9 **هەبێ**

**ئەم پێویستیانەی سیستم گرنگەکانە هەڵبەتە پێویستی تریشی هەیە بەڵام ئەمە گرنگەکانە**

**دابەزاندنی بەرنامەکە**

**بۆ دابەزاندنی بەرنامەکە ئەتوانن لە ئینتەرنێت بەدوایدا بگەڕێن یاخود هەر لەگەڵ ئەم کتێبەدا هاوپێچم کردووە، دوای ئەوەی کلیکت لە فایلەکە کرد ئەوی تری ئاسانە و وەك هەر بەرنامەیەکی تر بە نێکست نێکست دەڕۆیت تا ئەگاتە ئەو بۆکسەی کە پێداویستیەکان ئۆتۆماتیکی خۆی لە ئینتەرنێتەوە دائەبەزێنێت و ئینستۆڵی دەکات.**

## کردنەوەی بەرنامەکە

بۆ کردنەوەی بەرنامەکە وەکو هەر بەرنامەیەکی تر لە ستارتەوە بەرنامەکە دەکەیتەوە

ئەمەش ڕوکاری بەرنامەکەیە




ڕەنگە سورەکە دوو بەشی تیایە یەکەمیان بۆ دروستکردنی پرۆژەی نوێیە و دووەمیان بۆ کردنەوەی ئەو پرۆژانەیە کە دروستمان کردووە لە پێشتردا

ڕەنگە شینەکە ئەو پرۆژانەن کە کۆتا جار کارمان تێدا کردووە

ڕەنگە زەردەکە دوو بەشی تیایە یەکەمیان بۆ ئەوەیە کە دوای کردنەوەی پرۆژەکەت ئەو پەنجەرەیە دابخرێتەوە و دووەمیان بۆ ئەوەیە ئەگەر خانەکە چالاك نەکەیت لەکاتی کردنەوەی بەرنامەکە ئەمەت پیشان ناداتەوە

ڕەنگە سەوزەکە سێ بەشە یەکەمیان زانیاریت پێ دەدات دووەمیان ئاگادارت ئەکاتەوە کە کێشەیەك هەیە سێیەمیان ئەڵێ هەڵە هەیە

بۆ ئاستی سەرەتای ئەوەنە بەسە لەسەر ڕوکاری بەرنامەکە بیزانی، لە دواتردا دەچینە ناو بەشەکانی بەرنامەکە و گرنگی هەر بەشێك باس دەکەم

**پێش دەسکردن بە وانەکان ئەم دوو تێبینییە لەبەرچاو بگرە**

یەکەم/ بەشی خوارەوە کە هەڵە و کێشەکان و زانیاری لەسەر پرۆژەکەت پێ دەدات لەم کتێبە لەسەری ناڕۆم چونکە لێرەدا ئێمە کۆدێکی وا ئاڵۆز نانوسین کە هەڵەی تیابێ تا پیشانمان بدات، بەڵام پشت بەخوا لە زنجیرە کتێبەکانی داهاتوو لەکاتی هاتنە سەر ڕیچمان هەڵەکان شیدەکەمەوە و چۆنێتی چارەسەرکردنەکەشی ڕوندەکەمەوە

دووەم/ لە لاپەڕەکانی دواتر بەرچاوت دەکەوێت کە ناوی ئۆبجێکتەکان و زۆر شتی تری بەرنامەکە هەر بە دەربڕینی ئینگلیزی نوسیومە لەبەرئەوەی لە بەرنامەی وێردا کێشەی فۆنتی کوردی و ئینگلیزی هەیە وشەکان پاش و پێش دەکەوێت هەندێ جار و لە تایپکردنیش کاتی زۆر دەبات بۆیە پێم باش بوو بە یەك زمان بینوسم تا خێراتر تەواوبم و بڕواناکەم هێندە گرانبێت لێتێگەشتنیشی چونکە هەمان ناوی ئینگلیزییە و بە ڕێنوسی کوردی نوسیوومە.

دروستکردنی یەکەمین بەرنامە

بۆ دەستبەکاربوون و دروستکردنی بەرنامە کلیك لە نیو پرۆجێکت بکە




ئێستا ئەم پەڕەیەت بۆ کراوەتەوە




**لە شوێنی دیاریکراو ناوێك بۆ بەرنامەکەت بنوسە و ئۆکەی بکە**

**پاشان کەمێك چاوەڕێکە تا فۆرم و بەشەکانی تر دەکرێتەوە، لێرەدا بەپێی تایبەتمەندی کۆمپیتەرەکەت خێرای کردنەوەی بەشەکانی بەرنامەکە دەگۆڕێت**

**ئێستا کە ڕوکاری بەرنامەکە کرایەوە بەم جۆرە**




**ڕەنگە ڕەشەكە ڕوكاری ئەو بەرنامەیە كە دەتەوێت دروستی بكەی سەرەتا وەك دەبینیت بەتاڵە و هیچ بوتۆن و شوێنی نوسینی تیا نییە و كاركردنی ئێمە لێرەوە دەستپێدەكات كە هەڵدەستین بە دروستكردن و پێدانی كۆد و فرمان بەو بەشەی دەمانەوێت و بەشەكان پەیوەست دەكەین بە یەكەوە سەرەتا بۆ بینینی شێوەی بەرنامەكەت كلیك لەو دوگمە بكە شێوەی بەرنامەكەت پیشان دەدات بە بەتاڵی یان لەسەر كیبۆرد دوگمەی ئێف 5 بكە**




ئەبینیت شێوەیەکی بەتاڵی پیشانداویت ئێستا دەستدەکەین بە دروستکردنی شتێکی سادە تا فێری ئەووەبیت کۆدەکان  چۆن بنوسیت

لە بەشی تولس بوتۆنێك بێنە سەر فۆرمەکە

بوتۆن ئەو کەرەستەیە کە گرنگترین بەشە لە بەرنامەکان و بە کلیککردن لێی ئەو مەبەستەی بۆی دانراوە جێبەجێی دەکات جگە لە بەرنامەکان لە سایتەکانی ئینتەرنێتیش بوتۆن هەیە.

بۆ هێنانی بوتۆنەکە بەم شێوەیەی خارەوە بە ڕاکێشان بۆ سەر فۆڕمەکە داینێ



**پاشان قەبارەی بوتۆنەکەی ئەتوانیت بە کلیك کردن لە سوچەکانی بوتۆنەکە بە ویستی خۆت بگۆڕیت، ئێستا یەکەم کۆد لەسەر بوتۆنەکە دەنوسین**

**دەمانەوێت بە کلیك کردن لەم بوتۆنە بەرنامەکە دابخرێتەوە بۆ ئەو مەبەستە دەبڵ کلیك لەسەر بوتۆنەکە بکە ئەم پەڕەیەت بۆ دەکرێتەوە**




**ڕەنگە سورەکە پێناسی ئەو بەشەیە کە کۆدی تیا ئەنوسیت واتە بوتۆنەکە و پێویستە ئێمە کۆدەکە لە شوێنی ڕەنگی شین بنوسین**

**ئێستا بۆ ئەوەی کە کلیکمان لە دوگمەکە کرد بەرنامەکە دابخرێتەوە لەو شوێنە دەنوسین**

Close()



ئینجا بەرنامەکە تاقی دەکەینەوە ئێستا لەسەر کیبۆرد ئێف 5 دابگرە یان لەسەر بەرنامەکە دوگمە سەوزەکە دابگرە، دەبینیت بەرنامەکەت بەم شێوەیە کرایەوە

کە کلیك لەسەر بوتۆنەکە دەکەین ڕاستەوخۆ بەرنامەکە دائەخرێتەوە




بەم شێوەیە زانیمان کە چۆن کۆد دەنوسین ئێستا دێینە سەر تایبەتمەندی ئەو کەرەستەی کە دەیهێنین تا بتوانین بە ویستی خۆمان دەستکاری بکەین و دیزاینێکی جوانتری پێبدەین

یەکەمجار لە فۆرمی بەرنامەکەوە دەستپێدەکەین بۆ گەڕانەوە بۆ بەشی دیزاین کلیك لە تابی دیزاین بکە




پاشان كليك له ڕوكاری فۆڕمەكە بكە و تايبەتمەندیيەكەی لە خوارەوە دەبينيت



ئێستا یەك یەك بەپێی پێویستیمان بۆ دروستکردنی یەکەم پرۆژە تایبەتمەندیەکان باس دەکەین لەبەرئەوەی بە
پێویستی نازانم لە سەرەتاوە هەندێ شت باس بکەم کە لەوانە نییە کارت پێی بێ وەکو سەرەتا بەڵام بە
بەکارهێنانی زیاتر خۆت باشتر لە تایبەتمەندیەکان تێدەگەیت ئێستا بەپێی ژمارەکان لەگەڵ وێنەکە برۆ پاشان
بە نمونە هەمووی بەکاردێنین






یەکەم و دووەم زۆر گرنگ نین بەو مانایە نا کە شتێکی لاوەکیبن بەڵام مەبەستم ئەوەیە کە ئەکرێت دەستکاری نەکەیت تا لەکاتی نوسینی کۆدەکان کێشەت بۆ دروست نەکات لە دواتر تێدەگەیت کە ئەم بەشە سودی چییە

سێیەم بۆ گۆڕینی ڕەنگی باکگراوندی بەرنامەکەیە

چوارەم شێوازی چۆنێتی دەرکەوتنی نیشانەی ماوسەکە لەسەر فۆرمەکە

پێنجەم فۆنت و ڕەنگی نوسینی سەر فۆڕمەکە و شێوازی چاوردەوری فۆرمەکەیە

هەڵبژاردنی ئایکۆن بۆ فۆڕمەکە

حەوتەم دەستکاریکردن و دەرکەوتن و دەرنەکەوتنی هەر دوو ئایکۆنی گەورەکردن و بچوککردنەوەی بەرنامە لەگەڵ مینیمایزکردن

هەشتەم دەستکاریکردنی ناونیشانی فۆڕمەکە

## ئێستا بە نمونەیەك باسی فۆڕمێك دەکەین کە ئەم تایبەتمەندییەی هەبێت

ڕەنگی باکگراوندەکەی ڕەش بێت

ناونیشانی فۆڕمەکە "Alan"بێت

نیشانەی ماوسەکە ببێتە نیشانەی چاوەڕوانی

ڕەنگی نوسین سەوز بێت

چواردەوی فۆڕمەکە وابێت کە بەکارهێنەر نەتوانێت گەورە و بچوکی بکات

ئێستا دێین دەستکاری تایبەتمەندی فۆڕمەکە دەکەین بەو شێوەیەی دەمانەوێت

**بۆ ڕوبەی فۆنتەکە بە ویستی خۆت نیشانەی ماوسەکە لە سوچی فۆرمەکە بگرە و بیجوڵێنە پاشـان بـەپێی ئـەم وێنەیە دەستکاری تایبەتمەندی دەکەین**




**ئێستا دوای ئەوەی تایبەتمەندیەکانت بەو شێوە ڕێکخست کلیك لە دوگمەی بینین بکە یان لەسەر کیبۆرد ئێف 5 بکە بەم شێوەیە فۆرمەکە دەبینیت**




**وەك دەبینیت بەو شێوەیە دیزاینمانکرد کە ویستمان**

**ئێستا باسی چۆنێتی هێنان و دیزاینکردنی ئۆبجێکتەکان دەکەین لەگەڵ چۆنێتی کۆد نوسین و بەستنەوەی کەرەستەکان بە یەکترەوە**



به ڕاکێشان یان کلیك کردن و پاشان لەسەر فۆڕمەکە دروستکردن ئەتوانیت دوگمەیەك دروستکەیت کە یەکێکە لە ئۆبجێکتە زۆر گرنگ و بەکارهاتووەکان وەك دەبینیت ڕاستەوخۆ بێ دەستکاریکردن ڕەنگی نوسینی دوگمەکە سەوزە چونکە ئێمە پێشتر ئەو تایبەتمەندیەمان دا بە فۆڕمەکە کە نوسینەکان سەوز دەربکەون، بەڵام ئەتوانین دەستکاریشی بکەین ئێستا دێین دوگمەکە بەم شێوەیە دیزاین دەکەین




بەهەمان شێوەی فۆڕمەکە هەر ئۆبجێکتێکیش کۆمەڵێ تایبەتمەندی خۆی هەیە ئەویش بەپێی کاری ئۆبجێکتەکە بۆیە وا بەباشتر دەزانم لەکاتی بەکارهێنان باسیان بکەم بەپێی پێویستی کارەکان، تایبەتمەندی فۆڕمەکەشم لەبەر ئەوە باس کرد کە سەرەتایەك بێت بۆت تا بزانی چۆن دەستکاری تایبەتمەندیەکان دەکەیت ئێستا بۆ دروستکردنی ئەو شێوەی سەرەوە سەرەتا کلیك لە بووتۆنەکە بکە پاشان وەرە بۆ بەشی تایبەتمەندیەکانی بەم شێوەیە بیگۆڕە









ئێستا سەیری فۆڕمەکە بکە ئەبینیت دوگمەکە ئەو تایبەتمەندیانەی وەرگرت ئینجا دێین کارێك بەم دوگمە دەدەین ئەویش بە نوسینی کۆ

ئەم دوگمە وا لیَ دەکەین کە کلیکمان لێکرد مەسج بۆکسێکمان بۆ بکرێتەوە و تیایدا بنوسرێت کارەکە سەرکەوتووبوو

بۆ ئەم مەبەستە دوو کلیك لەسەر دووگمەکە بکە بۆئەوەی بچیتە بەشی کۆد نوسین و ئەم کۆدە بنوسە

MessageBox.Show(“کارەکە سەرکوتوو بوو”)




بەلاَم هەولَدە کۆدەکە کۆپی مەکە و هەر لە ئێستاوە خۆت فێری ئەوە بکە خۆت کۆد بنوسیت نەك کۆپی پەیستی بکەی

ئێستا کلیك بکە بۆ بینینەوەی کارەکەت پەنجە بنیَ بە دوگمەی ئێف 5

ئەووش ئەنجامی کارەکەمان




**ئەمە کۆدێکی زۆر سادە بوو نوسیمان تەنها بۆ ئەوەبوو کە بزانیت کۆدەکان چۆن دەنوسرێت و چۆن کاردەکات**

**ئێستا دێین کارەکان بەیەکەوە دەبەستینەوە و ئۆبجێکتێکی تر دەناسێنین کە ئەویش ئۆبجێکتی شەوێنی نوسینە**

**لە بەشی پێداویستییەکان تێکست بۆکسێك بێنە و لەسەر فۆڕمەکە داینێ لەگەڵ بوتۆنێك**

**کاری ئەم تێکست بۆکسە ئەوەیە کە ڕێگە بە بەکارهێنەر دەدات ئەوەی دەیەوێت تیا بنوسێت هەڵبەتە دوای دێینە سەر تایبەتمەندیەکانی کە چۆن هەنێ شت قەدەغە بکەی لە بەکارهێنەر تیا بنوسێت یان چەند پیت بتوانێت بنوسێت و یان چۆن بتوانێت هیچی تیا نەنوسێت بۆ کارێکی تایبەت داینێیت کە ئەمانە هەمووی کاری گرنگ و سەرنجڕاکێشی پێدەکرێت و ڕوکاری بەرنامەکە جوانتر دەکات.**

ئێستا دێین سادەترین کۆد تاقیدەکەینەوە لەگەڵ بوتۆنەکە کارەکە دەکەین چونکە زیاتر تێکست بۆکس لەگەڵ ئۆبجێکتی تر بەکاردێت کەم جار هەیە بەتەنها بتوانین کاری پێبکەین بۆیە زیاتر لەگەڵ ئۆبجێکتی تر بەکاری دێنین بەتایبەتی بوتۆن بەڵام کە تۆ لە کاری بوتۆن و تێکست بۆکسەکان تێگەیشتی لەدوایدا خۆت دەتوانیت فکرەی تازەی تیا بەکاربێنیت، چونکە پرۆگرامسازی زۆربەی فکرەیە و تەنانەت ئەگەر شتێکی کەمیش بزانیت ئەتوانیت پەرەی پێبدەیت و تازەگەری تیا بکەیت.

دوای ئەوەی بوتۆنەکە و تێکست بۆکسەکەت هێنا ئێستا بەرنامەیەك دروست ئەکەین کە کاتێك کلیکمان لە بوتۆنەکە کرد ڕاستەوخۆ بە بۆکسێك ئەو نوسینەمان پیشان بدات کە لە تێکست بۆکسەکە دەینوسین بۆ ئەم مەبەستە ئەم کۆدە لەسەر بوتۆنەکە بنوسە وەك وێنەکە

Messagebox.show(textbox1.text)




ئەم کۆدە واتە ئێمە بە بەرنامەکە دەڵێین ئەگەر کلیکمان لەسەر بوتۆنەکە کرد با ئەو مەسجەی پیشانمان ئەدات ئەو نوسینەبێت کە لە تێکست بۆکسەکە نوسراوە

ئێستا ئێف 5 بکە بۆ بینینی بەرنامەکەت و لەو بۆشای نوسینە شتێك بنوسە و کلیك لە بوتۆنەکە بکە دەبینیت ئەوەی نوسیوتە پیشانت ئەدات وەکو ئەم وێنەیەی خوارەوە




**ئێستا کۆدەکە دەستکاری دەکەین و وا لە بەرنامەکە دەکەین کە نوسینێکی خۆمان جێگیری بکەین و نوسینێکی بەکارهێنەر بینوسێت بۆ ئەم مەبەستەش ئەم کۆدە دەنوسین**

Messagebox.show(“baxerbeit ” &textbox1.text)

**وەك ئەم شێوە**

```
Form1.vb    Form1.vb [Design]
(General)    (Declarations)
Public Class Form1

    Private Sub Button1_Click(ByVal sender As System.Object, ByVal e As System.EventArgs) Handles Button1.Click
        MessageBox.Show("baxerbeyt " & TextBox1.Text)
    End Sub
End Class
```

لێرەدا ئێمە بە بەرنامەکە دەڵێین کە کلیکمان لە بوتۆنەکە کرد ئەو نوسینەمان بە شێوەیەکی جێگیر بۆ پیشان بدات کە لە نێوان دوو کۆتەیشنەکەدایە و لەگەڵ ئەوەشدا ئەو نوسینەمان پیشان بدات کە لەناو تێکست بۆکسەکە دەینوسین لێرەدا هێمای & گرنگە بەکاری بێنیت چونکە واتای پیتی (و) دەگەیەنێت. ئێستا بەرنامەکەت رەن بکە و ئەنجامەکەی ببینە




وەکو سەرەتایەك ئەوەنە بەسە تا ئێرە لەسەر تێکست بۆکس بیزانیت لە دواتر بە پشتیوانی خوا باسێکی زیاتری دەکەین و دیزاین و بەرنامەی سەرنجراکێشی پێدروست دەکەین

ئێستا ئۆبجێکتێکی تر دەناسێنین کە ئەویش کاری گرنگی هەیە بەتایبەت بۆ دیزاینی بەرنامەکە ئەویش ئۆبجێکتی لەیبڵ




ئەم ئۆبجێکتە ئەتوانین ئەو نوسینانەی پێ بنوسین کە جێگیرن و بەکارهێنەر ناتوانێت دەستکاریان بکات تا خۆمان لە بەرنامەکان ڕێگەی پێ نەدەین ئەم ئۆبجێکتە زیاتر بۆ یەك مەبەست بەکاردێت کە ئەویش ڕێنمای و نوسینی جێگیرە و زیاتر لەگەڵ دوو ئۆبجێکتەکەی تر بەکاردێت بۆ ئەو مەبەستە ئێستا فۆڕمێکی بچووك دیزاین ئەکەین و هەرسێ ئۆبجێکتەکەی کە باسمانکرد تیایدا دائەنێین تا بزانیت چۆن بەرنامەیەکی بچووك دروست دەکەیت لەو سێ ئۆبجێکتە. سەرەتا ئۆبجێکتەکانی تر بسڕەوە و ئەم ئۆبجێکتانە بێنە سەر فۆرمەکە

3 دانە لەیبڵ و 2 دانە تێکست بۆکس و 1 دانە بوتۆن و بەم شێوەیە لەسەر فۆرمەکە دایبنێ




ئێستا ڕەنگ و دیزاینێکی جوانتر ئەدەین بە بەرنامەکەمان بۆ ئەو مەبەستە لە فۆڕمەکەوە دەستپێدەکەین کلیك لە شوێنێکی بەتاڵی سەر فۆڕمەکە بکە تا تایبەتمەندیەکانی پیشان بدرێت و پاشان بەم جۆرە تایبەتمەندیەکان ڕێکبخە




ڕەنگی باکگراوند




ڕەنگی نوسینی سەر فۆڕمەکە




ناونیشانی بەرنامەکە

ئێستا سەیری بکە فۆرمی بەرنامەکە بەم شێوەی لێهاتووە




ئێستا دێین بوتۆنەکە دیزاین دەکەین بۆ ئەم مەبەستەش کلیك لەسەر بوتۆنەکە بکە و بەم شێوەیە تایبەتمەندیەکەی ڕێکبخە




نوسینەکەی




ڕەنگی نوسینی ناو بوتۆنەکە




ڕەنگی باکگراوندی بوتۆنەکە

بچۆرە سەر فۆڕمەکە ئەبینیت بوتۆنەکەش ئەم تایبەتمەندیەی وەرگرت




ئینجا دێنە لەیبڵەکان ڕێك دەخەین بۆ ئەم مەبەستە کلیك لە لەیبڵی 1 بکە و تایبەتمەندیەکانی بەم شێوەیە ڕێکبخە






به هەمان شێوە لەیبڵەکەی تر ڕێکبخە بەڵام لە بری ناو لە تێکستەکە نوسینەکەی بگۆڕە بۆ گروپ و لەیبڵی 3 ئەوە بنوسە کە ئەتەوێت و لەبەر ئەوەی بە فۆنتی کوردی نوسیومانە بۆیە وا جوانترە شوێنی لەیبڵەکان و تێکست بۆکسەکان ئاڵوگۆڕ بکەی ئەمە تەنها بۆ ڕازاندنەوەی بەرنامەکە بوو پاشان سەیری فۆڕمەکە بکە دەبینیت فۆڕمەکە بەم شێوەیەی لێهاتووە




ئێستا ڕێکخستنی فۆڕمەکە تەواو ئینجا بەرنامەیەك دەنوسین بە شێوەیەك کە بەکارهێنەر ئەو دوو بۆشایەی پڕکردەوە بەرنامەکە پێی بڵێ کە تۆ ناوت فلانە و لە فلان گروپی ئەم تەنها بۆ ڕاهاتنی نوسینی بەرنامەیە دەنا ئەمە شتێکی زۆر سادەیە بەڵام سەرەتایەکی باشە تا بزانیت چۆن کۆد دەنوسیت

لەسەر بوتۆنەکە ئەم کۆدە بنوسە بەڵام ئاگاداری بەکارهێنانی هێما و بۆشاییەکان بە!

Messagebox.show(“to nawt “ & textbox1.text & “a” & “ w la groupy “ & textbox2.text & “et” )

```
Private Sub Button1_Click_1(ByVal sender As System.Object, ByVal e As System.EventArgs) Handles Button1.Click
    MessageBox.Show("to nawt  " & TextBox1.Text & "a" & " w la groupy  " & TextBox2.Text & "et")
End Sub
End Class
```

ئەم کۆدە واتا بەرنامەکەمان وا دارشتووە کە بە کلیککردن لەسەر بوتۆنەکە ئەو نوسینانەی کە بەرەنگی سور نوسراون بە جێگیری پیشانی بدات و ئەو شوێنانەی کە نوسراون تێکست بۆکس ئەوە ئەو نوسینانەیە کە بەکارهێنەر ئەینوسێت لە شوێنی نوسیندا ئێستا بەرنامەکە رەن بکە و دەبینیت کە دروستبووە بەم شێوەیە







ئەگەر تێبینی ئەوەت کردبێت کە نوسینی بۆشایی لە لە پاش نوسینە جێگیرەکان سودی ئەوەی هەیە کە نەیهێشت نوسنەکانی بەکارهێنەر تێکەڵ بە نوسینە جێگیرەکان ببێت.

ئەمەی تا ئێستا باسمان کرد راهاتنێك بوو بۆ کۆدنوسین و ناساندنێکی کەمی بەرنامەکە بوو و یەکەم بەرنامەشمان دروستکرد بۆ فێربوونی بەکارهێنانی کەرەستەکان، لێرەدا بۆیە زۆر ورد و هەنگاو بە هەنگاو و بە وێنەوە رونمکردەوە تا سەرەتایەکت هەبێت لە بەرنامە نوسیندا، بەڵام لە ئێستا بدواوە وردە وردە کارەکانمان ئەبەینە ئاستێکی بەرزتر و تا رادەیەك لێرەوە فکرەی خۆت سودی دەبێت و کارەکان ئاڵۆزتر دەبێت و لێرەدا ئاشنات دەکەم بە چەند ئیررەرێك کە لەکاتی رەنکردنی بەرنامەکە توشت دەبێت و وردە وردە دەستدەکەین بە دروستکردنی پرۆژە، بەڵام لێرە بەدواوە پێویستە خۆت بزانیت شوێنی کۆد نوسین کوێیە و چۆن کەرەستە و فۆرم دیزاین دەکەیت و ئەوەی باسکرا ئەبێ خۆت زیاتر دوبارەی بکەیتەوە تا بەتەواوی رادێی لەگەڵ بەکارهێنانی بەرنامەکە.

رستەی مەرجەکان و سەرەتایەك بۆ نوسینی بەرنامەی ئاست بەرز

ئەوەی تا ئێستا باسکرا ناساندنی چەند ئۆبجێکتێك بوو کە بۆ کاری سەرەتای و تەنانەت بۆ بەرنامەی ئاست بەرزیش پێویستست بەو ئۆبجێکتانە دەبێت لێرە بەدواوە بەپیی چەند مەرجێك فرمان بە بەرنامەکە دەکەین واتە کارێك دەکەین بۆ نمونە ئەگەر کلیکمان لەسەر بوتۆنێك کرد کارێکمان بۆ بکات بەلاّم بەپێی چەند مەرجێك ئەو کارە بکات بۆ زیاتر ڕونکردنەوە بە نمونەوە باسی دەکەم

نمونەیەکی سەرەتای و فێربوونی بەکارهێنانی ڕستەی مەرجی

if, else, elseif لەم ڕستەدا ئەم سیٚ فەنشنە بەکاردێت

if واتە ئەگەر ئەتوانین پێی بلێین ئەگەرنا Else ئەتوانین بلێین ئەگەرێکی تر Elseif

ئێستا با بزانین ئەم سیٚ وشە کاریان چییە لە بەرنامەنوسیندا

چۆنێتی دروستکردنی بەرنامەیەك هاوشێوەی فەرهەنگ بە بەکارهێنانی ئەو سیٚ وشە

بۆ ئەم مەبەستە ئەم ئۆبجێکتانە بێنە سەر فۆڕمەکە

1 بوتۆن و 2 تێکست بۆکس و 2 لەیبڵ

بەم شێوەیە ڕێکیان بخە



**ئێستا بۆ دروستکردنی کاری وەرگێڕان لە ڕێگەی ڕستەی مەرجیەوە دەبڵ کلیك لەسەر بوتۆنی وەرگێڕان بکە و ئەم کۆدەی تیا بنوسە**

```
If TextBox1.Text = "open" Then
            TextBox2.Text = "كردنەوە"
        ElseIf TextBox1.Text = "please" Then
            TextBox2.Text = "تكایە"
        ElseIf TextBox1.Text = "blue" Then
            TextBox2.Text = "شین ڕەنگی"
        Else
            TextBox2.Text = "نییە وشە ئەم ببورە"
        End If
```

```
Public Class Form1

    Private Sub Button1_Click(ByVal sender As System.Object, ByVal e As System.EventArgs) Handles But
        If TextBox1.Text = "open" Then
            TextBox2.Text = "كردنەوە"
        ElseIf TextBox1.Text = "please" Then
            TextBox2.Text = "تكایە"
        ElseIf TextBox1.Text = "blue" Then
            TextBox2.Text = "ڕەنگی شین"
        Else
            TextBox2.Text = "ببورە ئەم وشە نییە"
        End If
    End Sub
End Class
```

**لەڕێگەی ئەم کۆدەوە ئێمە بە بەرنامەکە دەڵێین**

**ئەگەر لە شوێنی تێکشت بۆکسی یەکەم نوسرا ئۆپن ئەوا**

**لە شوێنی تێکست بۆکسی دووەم بنوسرێت کردنەوە**

**ئەگەرێکی تر لە شوێنی تێکست بۆکسی یەکەم نوسرا پلیز ئەوا**

**لە شوێنی تێکست بۆکسی دووەم بنوسرێت تکایە**

- ئەگەرێکی تر لە شوێنی تێکستبۆکسی یەکەم نوسرا بلو ئەوا
- لە شوێنی تێکست بۆکسی دووەم بنوسرێت ڕەنگی شین
- ئەگەر نا یان ئەگەر هیچ لەو مەرجانە نەبوو ئەوا
- لە شوێنی تێکست بۆکسی دووەم بنوسرێت ببورە ئەم وشەیە نییە
- تەواوبونی ئەگەرەکە
- ئێستا بەرنامەکە ڕەن بکە بزانین تەواوە










- ئەگەر کارەکانت هەنگاو بە هەنگاو کردبێت دەبینیت بێ کێشە دروست بوو

ئێستا کۆدی داخستنی بەرنامەکە لەسەر دوگمەی داخستن دەنوسین بۆ ئەو مەبەستە دوو کلیك لەسەر

- دوگمەی داخستن بکە و ئەم کۆدە بنوسە

```
Close()
```

- جارێکی تر بەرنامەکە ڕەن بکە دەبینیت بە کلیك کردن لە دوگمەی داخستن بەرنامەکە دادەخرێتەوە
- پوختەی ڕستەی مەرجی

ڕستەی مەرجی واتە ئێمە کارێك بە بەرنامەکە دەدەین بەڵام مەرجێکی بۆ دادەنێین کە ئەو مەجە جێبەجێ کرا ئەوکات ئەو کارە بکات کە پێمانداوە جا ئێتر مەرجەکە ئەگونجێت لەسەر بەکارهێنەرێت بۆ جێبەجێکردنی و ئەشگونجێت خۆمان بەپێی کات و ئۆبجێکتەکانی تر مەرجەکان جێبەجێ بکەین کە ئەمەیان ئالۆزترە لە دواتر باسی دەکەین.

## کردنەوەی فۆڕمێکی تر

بۆ ئاسانترکردنی کارەکانمان و ڕێکخستنێکی جوانتری بەرنامەکانمان ئەتوانین چەند فۆڕمێکی تر زیاد بکەین و بیبەستینەوە بە فۆڕمی یەکەمی بەرنامەکەوە

بۆ کردنەوەی فۆڕمی نوێ بەم ڕێگایە دەبێت




لە لیستی مینیو باڕ

Project>>Add Windows Form...

پاش ئەوە ناوی فۆڕمەکە دەستکاری مەکە چونکە و کلیك لەسەر ئاد بکە




**دەبینیت بەم شێوەیە فۆرمێکی نوێت بۆ کرایەوە ئێستا باسی ئەوە دەکەین چۆن ئەم دوو فۆرمە ببەستینەوە بە یەکەوە لەڕێگەی بوتۆنێك**

**بۆ نمونە بەرنامەیەکمان دروستکردووە ئەمانەوێت ئەم شتێکی تیا بنوسین دەربارەی دروستکەری بەرنامەکە بۆ ئەم مەبەستە ئەتوانیت هەر فۆرمەکەی پێشوومان ئەوەی فەرهەنگەکە دەستکاری بکەی لەویٚ ناوی دوگمەی داخستن بکە بە دەربارە بەم جۆرە**

```
Form2.Show()
```




پاشان بچۆرە سەر فۆرمی دوو بەم جۆرە بە لەیبڵێك و بوتۆنێك دیزاینی بکە




ئینجا بگەڕێوە فۆرمی یەکەم و ئەم کۆدە لەسەر بوتۆنی دەربارە بنوسە

```
Form2.Show()
```




**ئێستا بە بەرنامەکەمان ووت کە کلیکمان لە دوگمەی دەربارە کرد فۆڕمی دوومان بۆ بکاتەوە ئینجا**

**بەرنامەکەت ڕەن بکە و تاقی بکەوە بزانین کارەکە سەرکەوتوو بووە**



ئەبینیت کە سەرکەوتوو بوو و بە کلیك کردن لە دوگمەی دەربارە فۆڕمی دووەمان بۆ کرایەوە کە دەربارەی پرۆگرامەکە تیامانا نوسیوە ئەشتوانیت خۆت جارێکی تر لە فۆڕمی دووەم لەسەر دووگمەی داخستن کۆدی داخستنی فۆڕمەکە بنوسیت ئەوەش ئاسانە و باسم کردووە بۆیە زیاتر لەسەری ناڕۆم.

## بەکارهێنانی ڕستەی مەرجی بۆ کارکردن لەگەڵ فۆڕمەکان

لێرەشدا جارێکی تر ڕستەی مەرجی گرنگی خۆی هەیە و ئەتوانیت زۆر کاری سەرنجڕاکێشی پێبکەیت من لێرەدا تەناه فێرت ئەکەم کە کارەکان چۆن دەکرێت تۆ ئەتوانیت زۆر فکرەی جوانی تیا دروستبکەیت و تازەگەری تیا بکەیت چونکە پرۆگرامسازی هەمووی فکرەیە.

بۆ تێگەیشتن لەم کارە ئەمیش بە نونە ڕونی دەکەمەوە

بۆ نمونە بەرنامەیەکمان هەیە چۆن وا بکەم کە کەسێك کردیەوە فۆڕمی دووەمی پیشان نەدات تا مەرجەکە جێبەجێ نەکات واتە بۆ نمونە تا ناوی بەرنامەساز نەنوسێت فۆڕمی دووەمی بۆ نەکرێتەوە

بۆ ئەم مەبەستە پرۆژەیەکی نوێ بکەوە و سێ ئۆبجێکت بێنە سەر فۆڕمەکە بەم شێوەیە دیزاینی بکە



پاشان فۆرمێکی تر بکەوە بەو شێوەی پێشتر و گریمان بەرنامەکەت فۆرمی دووەمە ئەویش بەم جۆرە دابنێ




من هەر بە سادەی تەنها یەك لەیبڵم بەکارهێناوە ئەویش تەنها بۆ فێربوون نەك بەرنامەمە دروستکردبێت تەنها بۆ ئەوەی بزانی مەرجی فۆڕمەکان چۆن کار دەکات، ئێستا بگەڕێوە فۆڕمی یەکەم و لەسەر دوگمەکە ئەم کۆدە بنوسە

```
If TextBox1.Text = "alan" Then
    Form2.Show()
Else
    MessageBox.Show("بنوسە تەواوی بە ناوەکە تکایە")
End If
```

```
Private Sub Button1_Click_2(ByVal sender As System.Object, ByVal e As System.EventArgs) Handles Button1
    If TextBox1.Text = "alan" Then
        Form2.Show()
    Else
        MessageBox.Show("تكایە ناوەكە بە تەواوی بنوسە")
    End If
End Sub
End Class
```

**ئەم كۆدە واتە ئەگەر لە شوێنی تێكست بۆكسی یەك نوسرا ئالان ئەوا فۆڕمی دوو پیشان بدرێت ئەگەر ئەوو مەرجە جێبەجێ نەبوو ئەوا مەسج بۆكسێك پیشان بدرێ كە تیایدا نوسرابێت تكایە ناوەكە بە تەواوی بنوسە.**

**ئێستا بەرنامەكە ڕەن بكە و تاقی بكەوە بزانە مەرجەكە لەگەڵ فۆڕمەكە كاردەكات**




**ئەبینیت كارەكە سەركەوتوو بووە**

**تا ئێرە بەكارهێنانی ڕستەی مەرجی بوو لەگەڵ فۆڕمەكان**

**ئێستا هەندێ ئۆبجێكتی تر دەناسینین بۆ ئاسانتركردنی كارەكان و دیزاینێكی جوانتر بۆ بەرنامەكانمان**

## ئۆبجێکتی رادیۆ بەتن RadioButton

**ئەم ئۆبجێکتەش بە هەمان شێوەی ئۆبجێکتەکانی تر زیاتر بۆ کۆنترۆڵکردنی فۆرمەکە و بەرنامەکە بەکاردێت جگە لەوەی روکاری بەرنامەکەش جوانتر دەرازێنێتەوە و ئاسانکاری بۆ بەکارهێنەریش دەکات، ئەم ئۆبجێکتە لە یەك کاتدا لەسەر فۆرمەکە ناتوانیت دوو دانە ئەکتیف بکەیت کە ئەمەش کاری گرنگی پێدەکرێت لە بەکارهێناندا بۆ زیاتر رونکردنەوە بە نمونەیەك دەستپێدەکەین.**

**لەسەر فۆرمێکی تازە 3 دانە رادیۆ بەتن دابنێ و تایبەتمەندیەکەی بەم جۆرە رێك بخە**




**لەسەر هەر رادیۆ بوتۆنێك ئەم کۆدانە بنوسە**

```
    Private Sub RadioButton1_CheckedChanged(ByVal sender As System.Object, ByVal e As System.EventArgs) Handl
        TextBox1.Text = ("یەکەم")
    End Sub

    Private Sub RadioButton3_CheckedChanged(ByVal sender As System.Object, ByVal e As System.EventArgs) Handl
        TextBox1.Text = "دووەم"
    End Sub

    Private Sub RadioButton2_CheckedChanged(ByVal sender As System.Object, ByVal e As System.EventArgs) Handl
        TextBox1.Text = "سێیەم"
    End Sub
End Class
```

**من لەکاتی دیزاین ناوی رادیۆ بەتنەکانم پاش و پێش کردووە بۆیە کۆدەکان دووەم و سێیەم وا نوسیوە**

**ئێستا بەرنامەکەت ڕەن بکە دەبینیت بە کلیك کردن لە هەر رادیۆ بەتنێك تێکست بۆکسەکە داواکاریەکەت جێبەجێ دەکات و لە یەك کاتیشدا ناتوانیت لە رادیۆ بەتنێك زیاتر ئەکتیڤ بکەی گرنگی ئەمە لە بەشەکانی دواتر و کتێبەکانی تری ئەم زنجیرە دەردەکەوێت.**




**وەك دەبینیت ئەم ئۆبجێکتەش سەرکەوتوو بوو**

**ئۆبجێکتی پیکچە بۆکس**

**ئەم ئۆبجێکتەش کاری گرنگ دەکات و زیاتر بۆ دیزاینکردنی بەرنامەکە بەکاردێت بە هێنانی وێنە**

ئەم ئۆبجێکتە زۆر پێویستی بە ڕونکردنەوە نییە چونکە کارەکەی بەس ئەوەیە وێنە بهێنێت، بەڵام تایبەتمەندیەکەی گرنگە کە ئەویش باسی لێوەدەکەینچۆنێتی وێنە هێنانیش لەگەڵ نمونەکانی تر باسی دەکەین




ئۆبجێکتێکی تر ئەویش ئۆبجێکتی کۆمبۆبۆکس



**ئەم ئۆبجێکتەش وەك ئەوانی تر لە دیزاین دەوری خۆی هەیە و ئاسانکارییەکی زۆریشمان بۆ دەکات لەکاتی نوسینی بەرنامە بۆ ئەوەی بزانیت چۆن کاردەکات بە نمونەیەك باسی دەکەین**

**فۆرمێك بکەوە و ئەم ئۆبجێکتانەی لەسەر دابنێ**

**1 بوتۆن 1پیکچە بۆکس و 2 تێکست بۆکس و 1 کۆمبۆبۆکس و دوو لەیبڵ**

**بەم شێوەیە ڕێکی بخە**




**لێرەدا فێری بەکارهێنانی هەندێ تایبەتمەندی تر ئەبیت، پێشتر باسمان کرد کە چۆن وابکەیت بەپێی مەرجێك فۆرمێکی تر بکرێتەوە لەم نمونەدا وادەکەین مەرجەکان زۆرتربن و وشەی نهێنیش هەبێت ئەویش لەبەر ئەوەی فێری بەکارهێنانی شێوازێکی نوێی ڕستەی مەرجی ببیت و تایبەتمەندی زیاتری ئۆبجێکتەکانیش شارەزابیت.**

**ئێستا کلیك لە تێکست بۆکسی بەردەم وشەی نهێنی بکە و لە تایبەتمەندیەکان ئاوا دەستکاری بکە**



پاشان کلیك لەسەر کۆمبۆبۆکسەکە بکە و تایبەتمەندیەکەی بەم شێوە دەستکاری بکە







له باتی ئەو سێ وشەی من نوسیومە تۆ ئەتوانیت شتی تر بنوسیت بەپێی پرۆەکەی خۆت بەلاّم دەبێت بە ستونی بێت وەك ئەمە

پاشان کلیك لەسەر پیکچە بۆکسەکە بکە و لەو سوچەی سەرەوەی کلیك بکە




دوای ئەوانەی سەرەوە وێنەکە هەڵبژێرە و ئۆکەی بکە، بەڵام وەك دەبینیت کێشە لە دەرکەوتنی وێنەکەدا هەیە

بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە بەم جۆرە دەستکاری بکە



ئێستا کێشەی ئەوەش نەما و وێنەکە پڕاوپڕی پیکچە بۆکسەکەیە، ئێستا دێین کۆد لەسەر بوتۆنەکە دەنوسین

لێرەدا شێوازێکی تر لە مەرج بەکاردێنین کە ئەویش مەرجێك یان زیاترە و بە چەند وشەیەك مەرجەکان پێکەوە دەبەستینەوە کە ئەمانەن

## And

واتا (و) کە بۆ بەستنەوەی دوو کەرەستە بەکاردێت واتا ئێمە بمانەوێت بڵێین ئەگەر لە شوێنی نوسینی یەکەم ناو نوسرا و لە شوێنی نوسینی دووەم وشەکە نوسرا ئینجا مەرجەکە جێبەجێکراوە، بەڵام ئەگەر یەکێکیان جێبەجێ نەکرا ئەوا کارەکە نەکات.

## Or

واتە (یان) ئەمەیان بە هەمان شێوە بۆ دانانی مەرج بەپێی دوو کەرەستە، بەڵام لەم کاتەدا وشەی (یان) دەوری ئەوە دەبینێت کە ئەگەر یەکێك لە مەرجەکان جێبەجێ کرا کارەکە بکات ئیتر ئەگەر مەرجەکەی تریش جێبەجێ نەبێت کێشە نابێت.

لەم نمونەدا بە هەردوو شێوەکە تاقیدەکەینەوە

ئێستا فۆڕمێکی نوێ دروست بکە و بەم شێوەیە دایبنێ




فۆڕمێکی تریش و بەم شێوەیە



**ئێستا سیٚ فۆڕمان هەیە و فۆڕمی یەکەم سەرەکییە و دوو فۆڕمەکەی تر وا لیٚ دەکەین کە بە مەرج بکرێتەوە ئەویش بە بەکارهێنانی دوو تێکست و کۆمبۆبۆکسەکە**

**ئێستا لەسەر فۆڕمی یەك دەبلٚ کلیك لەسەر بوتۆنی چونەژورەوە بکە و ئەم کۆدەی لەسەر بنوسە**

**کۆدی یەکەم واتا داوا لە بەرنامەکە دەکەین کە بەکارهێنەر بەم ناو و پاسۆردە بتوانێت بچێتە ژورەوە و تەنها بۆیشی هەبێت فۆڕمی ئەدمینی دوو بکاتەوە**

**ناو:**Alan

**پاسۆرد:**123

**ئەم بەکارهێنەرە تەنها فۆڕمی ئادمینی دوو ببینێت**

**ئێستا کۆدەکە بەم شێوەیە دەنوسین**

**کۆدی دووەم واتا داوا لە بەرنامەکە دەکەین کە بەکارهێنەر بتوانێت بەو ناو و پاسۆردەی تر تەنها فۆڕمی سیٚ ببینێت**

```
        If TextBox1.Text = "Alan" And TextBox2.Text =
"123" And ComboBox1.Text = "admin2" Then
            Form2.Show()
        ElseIf TextBox1.Text = "azad" And
TextBox2.Text = "456" And ComboBox1.Text = "Admin3"
Then
            Form3.Show()
        Else
            MessageBox.Show("نەکراوە داخڵ داتایە ئەم جارێ")
        End If
```

```
Public Class Form1

    Private Sub Button1_Click(ByVal sender As System.Object, ByVal e As System.EventArgs) Handles Button1.Click
        If TextBox1.Text = "Alan" And TextBox2.Text = "123" And ComboBox1.Text = "admin2" Then
            Form2.Show()
        ElseIf TextBox1.Text = "azad" And TextBox2.Text = "456" And ComboBox1.Text = "Admin3" Then
            Form3.Show()
        Else
            MessageBox.Show("جارێ ئەم داتایە داخڵ نەکراوە")
        End If
    End Sub
End Class
```

**ئێستا بەرنامەکەت ڕەن بکە و بە هەر سێ شێوەکە تاقی بکەوە بزانە ئەنجام چ دەبێ**




**وەك دەبینیت بەو جۆرە فۆڕمی دووی کردەوە بەڵام ئەگەر بێت و شتێکی تر هەڵبژێرین**




**دەبینیت ناو و پاشسۆردەکەش تەواوە بەڵام لەبەر ئەوەی مەرجەکە کۆمبۆبۆکسی تیا جێبەجێ نەبوو کەواتە بەرنامەکە کارەکە ناکات و فۆرمەکە ناکاتەوە**

**لێرەدا هەڵەیەکم لە نوسینی کۆدەکان کردووە یەك پیتی هەڵەیە ئەم وەك راهێنان بۆ خۆتی جێدێڵم چاکی بکەی**

**ئێستا ئۆبجێکتێکی تر بەکاردێنین کە بەهەمان شێوە ئەویش کاری گرنگی هەیە و ئاسانکاری دەکات ئەیش ئۆبجێکتی چێك بۆکسە**




**بەکارهێنانی ئەم ئۆبجێکتە هەر لە رێگەی رستەی مەرجییەوە تاقیدەکەمەوە بەلاَم جیاوازی ئەم ئۆبجێکتە و رادیۆ بەتن ئەوەیە کە ئەمەیان ئەتوانیت لە یەك فۆرمدا زیاتر لە دانەیەك چالاك بکەیت بۆ زیاتر رونکردنەوە فۆرمێ بکەوە و ئەم ئۆبجێکتانە بێنە تا بزانی چۆن بەکاردێت**

**2 تێکست بۆکس 1 بوتۆن 3 چیك بۆکس**

**بەم شێوە دیزاینی بکە (بە دڵی خۆت)**

**وا باشترە تێکست بۆکسی یەکەم بەم جۆرە دەستکاری بکەی نەك بۆئەوەی لێرەدا پێویستمانە بەڵکو بۆئەوەی کە لە پرۆژەکانی داهاتو کە تێکست بۆکسێکی لەو شێوەت بینی کێشەت بۆ دروست نەبێت و بزانی چۆن وا دروستکراوە.**




**پاشان فۆڕمەکە بەم جۆرە دیزاین بکە**




**پاش دیزاینکردن ئەم کۆدە لەسەر بوتۆنەکە داخڵ بکە**

```
        If CheckBox1.Checked And CheckBox3.Checked
Then
            TextBox1.Text = "zmany kurdi w 3arabi"
        ElseIf CheckBox2.Checked And
CheckBox1.Checked Then
            TextBox1.Text = "zmany enlizy w kurdi"
        ElseIf CheckBox2.Checked And
CheckBox3.Checked Then
            TextBox1.Text = "zmany englizy w 3arabi"
        End If
```

**ئەم کۆدە واتە بەپێی چالاککردنی چیك بۆکسەکان لە تێکستەکان ئەوەمان پیشان بدات کە داای دەکەین**

**ئاگاداربە سەیری ناوی چیك بۆکسەکان بکە تا بە هەڵە داینەنێیت**

**پاشان بەرنامەکە ڕەن بکە و ئەنجامەکەی دانە دانە تاقیکەوە**




**خۆت هەوڵدە زیاتر لە کۆدەکان وردبیتەوە وەك لە سەرەتا ئاماژەم پێدا من تەواوی بەرنامەکەت پێناڵێم و ناشتوانم ئەو کارە بکەم بەڵام ئەوەی پێتەڵێم بەشێکە لە بەکارهێنانی خۆم بۆیە مەرج نییە من ئەوەی بزانم یان تاقیمکردبێتەوە لێرە بۆ تۆی ڕونکەمەوە بەڵکوو پێویستە خۆت لە کۆدەکان تێبگەیت و دەستکاری بکەیت و**

**دوبارە دایبرێژیتەوە و تاقیبکەیتەوە بەم شێوەیە ئاسانتر دەبێ بۆت و دەتانی زیاتر فێربی چونکە کۆمپیتەر بیرۆکە و بەکارهێنانە نەك لەبەرکردن**

**ناساندنی ئەم ئۆبجێکتەش تەواو**

**بە پشتیوانی خوای گەورە ئەگەر تەمەن رێگەی دا و کات هەبوو لە زنجیرە کتێبەکانی داهاتوو وەڵامی زۆر لە پرسیارەکان دەدەمەوە کە لەلات دروستدەبێت جگە لە وەڵامدانەوەی ڕاهێنانەکان کە لە کۆتا لاپەڕە دامناوە.**

**پشت بەخوا ئۆبجێکتەکانی تریش و بەتایبەت ئۆبجێکتە زۆر گرنگ و بەکارهاتووەکان کە تا ئێستا باسمان نەکردووە لە کتێبی داهاتوو بە تەواوی باسی هەمووی دەکەم و جگە لە نمونەکان پرۆژەیشی پێ دروست دەکەین.**

**بە پوختی ئەگەر تەمەن رێگەی دا پشت بەخوا کتێبی داهاتوو کتێبێك دەبێت لەرێگەیەوە فێری زۆر کۆد و پرۆژەی جوان ببیت کە بتوانیت لەو رێیەوە پەی بە تواناکانت ببەیت و بتوانیت فکرەی نوێ بدۆزیتەوە و بەرنامەی پێشکەوتو دروستبکەیت.**

**سوپاس بۆ ئەوکاتەی کە بە فێربوونت بەخشی**

**بۆ زانیاری گشتی سەردانی پەیجی ئالان ساینس بکەن**

m.facebook.com/AlanScience

## تێبینیەکان و وەڵامی ڕەخنەکان

فێرخوازی بەڕێز لەوانەیە لەم کتێبەدا کەمێك یان زۆر هەڵەت بەدیکردبێت چ هەڵەی ڕێزمانی بێت یان خاڵبەندی یان تەنانەت لە نوسینی کۆدەکان(جگە لەو کۆدەی خۆم پێم وتووی هەڵەی تیایە)، بەڵام هەوڵمداوە بەشێوەیەکی وا وانەکان باس بکەم بەو شێوەی کە خۆم فێربووم و پێم ئاسانترە بۆ فێربوون چونکە بەلای منەوە فێربوونی بە شێوەی هەڕەمەکی ئاسانترە و باشترە وەك لەوەی بە ڕیزبەندی باسی بەشەکان بکەم.

ئەم کتێبە بۆ ئاستی زۆر سەرەتا نوسراوە بۆیە لەوانەیە تۆ کەسێك بیت کە ڕەنگە هەندێ لە ڕونکردنەوە زیاد لە پێویستەکان بێزارکەر بووبێت لەلات، بەڵام لێرەدا مەبەستمە کە کەسانی سەرەتای بە باشی تێبگەن و لە بنچینەی کارەکان تێبگەن بۆیە بەلاتەوە ئاسایی بێت ئەگەر ئەوەی باسم کردووە هیچی تازەی بۆ تۆ تیا نەبووبێ یان هەموویت زانیبێ، ئەوە بزانە کەسانی تر هەن نایزانن یاخود پێویستیان بە ڕونکردنەوەی زیاترە.

لە وانەکانی کۆتای کەمێك ئیهمالی لە ڕونکردنەوەدا پێوە دیارە ئەویش لەبەرئەوە بەو شێوەیە بە ئیهمالی هەندێ شتم باسکردووە و هەندێکم باس نەکردووە تا خۆت بەدوایدا بگەڕێیت چونکە من دڵنیام لەوەی کە ئەگەر تۆ کەسێك بیت خولیای پرۆگرامسازیت هەبێ ئەوە ئەتوانیت زۆر شتی جوانتر فێربیت، بەڵام من لێرەدا هەر ئاشنام کردووی بە بنچینەی کارەکان.

**ڕاهێنانەکان**

**5 پرسیار و هەر پرسیاری 5 نمرەی لەسەرە، وەڵامی ڕاهێنانەکان بە کتێبی داهاتوو دەنوسم (دیزاین بە خواستی خۆت)**

**1-بەرنامەیەك دروستبکە لە سێ فۆڕم پێکبێت و فۆڕمی یەکەم بۆ کردنەوەی فۆڕمەکانی تر بێت لە ڕێگەی وشەی تێپەڕ، دوو فۆڕمەکەی تر یەکیان فەرهەنگێك بێت و یەکیان دەربارەی پرۆژەکەت بێت و ئەو سێ فۆڕمە ببەستەوە بە یەکەوە بەجۆرێك کە بەکارهێنەر تەنها بتوانێت لەڕێی بوتۆنەکانەوە کار بکات.**

**2-بەرنامەیەك دروستبکە وای دانێ لەسەر کۆمپیتەرەکە جێی دڵێ و وشەیەکی نهێنی تیایە و دەتەوێت بە یەکێك لە پێن هاوڕێتی بدەیت، چۆن وادەکەیت جگە لەو پێنج کەسە کەسی تر نەتوانێت وشەکە ببینێت؟؟ و چۆن وا دەکەیت کە هەرکەسێکیان بیانەوێت ئەو وشە ببینن بە داخڵکردنی ناوەکانیان وشەکە ببینن؟؟**

**3-بەرنامەیەك بنوسە کە تیایدا داوا لە بەکارهێنەر بکەیت گروپی خوێنەکەی دیاری بکات و بەپێی گروپی خوێنەکەی فۆڕمەکەی تایبەت بەو گروپەی بۆ بکرێتەوە بە بەکارهێنانی کەرەستەی تایبەت.**

**4-بەرنامەیەك بنوسە هەموو ئەو کەرەستانەی باسکراوە لەم کتێبەدا لە ڕستەیەکی مەرجی تیا بەکاربێنیت.**

**5-بەرنامەیەك بنوسە کە ڕێگە بە بەکارهێنەر بدات لەڕێی کۆدی تایبەتەوە بتوانێت بەرنامەکە دابخاتەوە**

# کۆتای بەشی یەکەم

**لە نزاکانتان بێبەشم مەکەن**